# وشەکانی نیشانە ــ واتاناسی
# ١ فەرهەنگۆکی پسپۆڕانە


## ن: ئێلمیرا داوود

**و. مەسعود بابایی**


ئەم فەرهەنگۆکە ئەو وشە پسپۆڕییانەی واتاناسی و نیشانەناسی دەگرێتەوە کە لە زانستی لێکدانەوەو راڤەی دەقدا و لە هێرمێنۆتیکای مودێرندا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ. تێکڕای وشەکان فەرەنسین و بە بەراورد لەگەڵ فارسی و ئینگلیزی و بەگوێرەی پێکهاتەی زمانی کوردی وەرگێڕدراون و لەم پێناوەدا بەشێك لە وشەکان لە زارەکانی زمانی کوردییەوە وەرگیراون و رەنگە بۆ خوێنەر کە ئاشنای زارەکانی زمانی کوردی نەبێت نامۆبن. هەوڵدراوە هاوواتای شیاو بدۆزرێتەوە و خۆم بە زارێکی دیاریکراو نەبەستۆتەوە و بەهیوام خوێنەریش خۆی پێیانەوە ماندوو بکات

A

**پێوار، نەبوون** Absence

یەکێك لەو پەیڤانەیە کە پەیوەستە بە نائارایی/ئارایی (حچور) یەوە و روونکردنەوەی شێوەی لە ئارادابوونی واتایی بابەتەکانی دانایی لە ئەستۆیە.

Abstrait

**داڕنراو، داماڵراو، رووت**

هەر پەیڤ و گوتەیەك سەر بە زمانی سرووشتی و یا بان ـ زمان بێت داڕنراوی پێ دەوترێ و لە بەرانبەر سیمادار و وێنایی پۆلێن دەکرێت.

Abyme (en)

## ئاوێنە ئاسا، تێك تەنراو

زاراوەی وەرگیراو لە ئاندرەژید کە ئەو خۆی بۆ رۆمانی دراوسازان (سکەسازان) بەکاری هێنا. بە بەرهەمێك دەگوترێ کە لەنێو بەرهەمێکی دیکەدایە و لێی دەدوێ و ئەمە لە کاتێکدایە کە هەردووك سیستمی ئاماژەپێکەر ( نڤام دال) هەریەك سیستم بن : حیکایەت لەنێو حیکایەتدا، فیلم لەنێو فیلمدا، نیگار لەنێونیگارێکی دیکەدا و...هتد.

پێکهاتەی ئاوێنەیی یا ئاوێنەیی، پێکهاتەیەکە کە بەرهەمێکی دیکە وەك ئاوێنەیەك لەخۆدەگرێ.

بەرهەمانێك کە پێکهاتەیەکی ئاوێنەئاسایان هەیە" بان ـــ نیشانەناسی"ن و تاودەرانە (انعکاسی)ن. هۆکاری پێکهاتەی ئاوێنەیی بە چەشنێکی ئاوێنەیی، بەگشتی هەمەکی یا هەندەکی (کلی یا جزئی) بەلام وەفادارانە، رێچکەی بەرهەم بەر نادا.چەشنی چیرۆکەکانی هەزارویەکشەو.

Acceptable

## شایانی پەسند، بەجێ، درووست

بە پەیامێك دەگوترێ کە ئەو رەمزانەی رەچاوکردبێت کە مەبەستمانن: ١ـ تەنیا لەبەرگرەوەی ئەو مۆرفیمانەیە کە پەیوەستن بە رەمزەکانەوە، ٢ـ لەباری رستەسازی (سینتاکس) و وشەناسییەوە (مۆرفۆلۆژی) چاك بیچمیان گرتبێ (واتە لەباری رێزمانییەوە)، ٣ـ لە رووی واتایی یا واتاناسییەوە بە باشی درووست کرابن.

شایانی پەسندبوونی رستەکان ناشێ بەڵێ و نەخێر وەدیار بخرێت، بەڵکوو بۆ هەر زمانێکی تایبەت دید و تێگەیشتنێك هەیە کە خۆیشی خاوەنی پلەبەندیی واتاییە. ئارایی نیشانەیەکی خۆیی ( نیشانە لە ئاخێو "خگاب، گفتمان" چ لە گشتەوە بۆ پاژ (جزو) بێت و چ نەبێت، نابێتە هۆی ئەوە تا پەیامی رستە ئیدی پەسند نەکرێت. هەندێ رستەی نەشیاو لە پێوەندییەزمانییەکان (لە زمانێکەوە تا زمانێکی دی) پاراو و رەوان و یەکلاکەرەوەن کە ئەمە بەشێکە لە هەلومەرجەکانی وەرچەرخانی زمان.

Acronyme

## وشەی کورتکراوە

وشەی کورتکراوە وشەیەکە کە دەتوانێ وەك وشەیەکی ئاسایی گۆ بکرێت. وەك "Unicef" رێکخراوی پشتیوانی لە منالان" یا "USA" ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئامریکا. لە وشەی کورتکراوەدا یا سەرەناوەکە گۆ دەکەین وە "S.O.S" ( بە واتای فریا)، کە ئاماژەپێکەرێکی بان ـــ زماننناسییە، لەو دۆخەدا سەرەناو، دەبێتە تاك وشەیەکی تاقانە کە بنەمای دارشتنە.

elle Actanciel

## پێوەندیدار بە باشقەی کردەکی، کردەکی

باشقەی کردەکی بەرای گرێماس Greimas چەمکەکەی ئەوەیە کە دەبێ کەسێتییەکان لە پانتایی گێڕانەوەییدا وەکوو باشقەی کردەیی سەیر بکەین، نەك لە پانتایی رۆڵێك کە لە چیرۆکدا لە ئەستۆیاندایە.

***

## Actant
## هۆكار

هۆكار كه باشقەی كردەكی رادەپەڕێنیٚ تەنیا دەورگێڕێك نیە و دەتوانیٚ چەندین رۆڵی هەبێت. گێرماس گەلاڵەی باشقەی كردەكی (الگوی كنشی) ی خۆی بە سیٚ تەوەر دابەش دەكات:

١ـ مەشقكردن (ویستن) و تێكۆشان : بكەر ـــــ شمەكی بەنرخ.

٢ـ تەوەری پێوەندییەكان (زانین): نێردەر ـــــ ( بكەر ـــ بەركار) بەدەست گەییو (وەرگر)

٣ـ تەوەری ململانێكان ( توانین): دیاریكراو ـــــ (بكەرـــ بەركار) ـــ نەیار

لە دیدی گێرماسەوە دیاریكراو ئەو شتەیە كە یاریدەی وەدیهاتنی خواستی دەدات، لە كاتێكدا كە نەیار لەگەڵ ئەم خواستەدا نەیاری دەنوێنیٚ.

## Action
## كردە

تیۆریی كردەی مرۆیی لەسەر بنەمای تیۆریی ت.پارسۆنێز T.parsons و ئا. شیلز E.A.Shils سیستمێكە لەبەرگرەوەی: سیستمی كەسایەتی، سیستمی كۆمەلایەتی و سیستمی ژینگەیی.

مۆریس Morrris پێوەندیی نێوان باسەكانی پێوەندیدار بە شێوەی كەڵكوەرگرتن لە بەكارهێنانی نیشانەكان لە كردارگەراییدا بەم چەشنە دەخاتەڕوو:

| كەس | كردە | نیشانە | بایەخ |
|---|---|---|---|
| جیهان | درك پێكردن | دیاریكردن | بیٚ هۆگری |
| پسپۆڕ | دەستوەردان | نەسكدانان (تجویز) | زاڵبوون |
| هونەرمەند | دەكاركردن (مصرف) | نرخاندن | هاوپەیوەستی |

## Adjuvant
## دیاریكراو

لەباشقەی كردەكیی گێرماس،كەسێكە كە یاریدەی وەدیهاتنی خواستی بكەر دەدات.

## Allégorie
## چیرۆكئاسا/ ئەلیگۆریا

ئەلیگۆریا، زەقكردنەوەی تیۆرییەكی داڕنراو (ئەبستراكت) ە كە روخساری یەكە (واحد) لەودا بایەخی روخساری هەمەكیی هەیە. ئەلیگۆریا دەشیٚ زمانی یا وێنەیی بێت.

Allocutaire

**بەربێژ ( مخاگب )**

کەسێکە کەلەگەڵی قسان دەکەین و وەرگری پەیامی ئێمەیە.

Allographique

**بێ جێگرەوە، بێ هاوتا ( بێ ئەلتەرناتیڤ )**

بەهونەرێك دەوترێ کە لە بیاڤیدا هاوتاسازی نەلواوە. شیعر هونەرێکی بێ جێگرەوەیە.

Alphabet

**ئەلفوبێ**

گشتکۆی پیتەکانی زمانێك کە بەزۆری بە شێوەی جیاجیا و تاك تاك، واتایان نیە، ئەگەر لە تەنیشت یەکدییەوە ریز بن وشـەکان دەرِەخسێنن. لە زمانی رووسیدا "Я " دوایین پیتی ئەلفوبێیە کە بەتەنیایی " من" دەگەیەنێ و بە ناوێزە دێتەئەژمار.

Ambiguïué

**تەمتومان، لێڵی، تەمومژ، ناروونی( ابهام )**

تایبەتمەندیی پەیامێك (زمان یا سیستمێکی دیکەی واتایی) کە بۆ وەرگر زیاتر لە واتایەکی هەیە و ئەو ناتوانێ بـە دڵنیاییـەوە لێکی بداتەوە.

رەواندنەوەی تەمتومان ـــ زانیاری یا زانیاریگەلێکە کە لێڵی و ناڕوونی بە قازانجی تەنیا یەك واتا دەرەوێنێتەوە.

تێبینی: دەربڕینی پەیامێك لەلایەن نێردەر ئەگەر بێتو مەبەستی ئەو گواستنەوەی تاکە واتایەك بێت لێڵیی تیا نیە، بەڵام ئەگەر نێردەر خوازیاری گەیاندنی کۆمەڵە واتایەك بێت، ئەمە ئیدی قسەوباس لەمەڕ هونـەری رەوانبێـژی و زمانپـاراوی و کایـە لەگـەڵ نیشانەکان دەبێت.

Anachronie

**هەڕەت پشێوی**

نەسازانی نێوان تەکووزداری (نظم) ی مێژوو و گێڕانەوەیە. هەڕەت پشێوی دەشێ پێداچوونگەرایانە یا خۆ پێشگیرانە بێت.

Anagramme

**بەراوەژوو ( مقلوب )**

لەشیعردا باوە. وشەی وەدەستهاتو لە ئەنجامی جێگۆڕکێی پیتەکانی وشەیەکی دیکەوە سەرهەڵدەدات.

Analepse

**گەڕانەوە بۆ رابردو، پاشەوەنواڕی**

گەڕانەوە بۆ رابردوو یا پاشەوەنواڕی لە دەقدا، هاوواتای "فلاش بەك" ە کە لە سینەمادا بەکاردێت.

## Analogique
## هاوشێوەیی ، هاوتایی

دەدرێتە پاڵ ئەو بابەت و بارودۆخانەی کە بە تەواوی تۆکمەن و لە شێوەی یەکەی ژماردن نین. واتە نموونەی هاوشێوەیان نیە و ئەمە لە دەقدا روودەدات.

## Analycté
## شرۆڤانی، شیکاری پەسندی

تایبەتمەندیی شیکاری پەسندی (شرۆڤانی) ی داوەرییەك یا باوەڕێك

ــ شیکاری پەسندیی ئاشکرا (رەها)، رێکەوەندێك (عبارت) ی جەختکەرانەیە کە گوزارەکەی بە شێوەیەکی راشکاو (رەها) دەچێتەوە سەر بکەر، وەك : یەك دەرهەم دەرهەمێکە.

ــ شرۆڤانیی نائاشکرا، رێکەوەندێکی جەختکەرانەیە کە گوزارەکەی بەشێوەیەکی راشکاو (رەها) ناچێتەوە سەر بکەر، وەك سێو میوەیەکە. کەوتنەخوارەوە واتە داکەوتن.

ــ شرۆڤانیی مۆرفۆ ــ سیمانتیك، رێکەوەندی جەختکەرانەیە کە گوزارەکەی بکەر بەگوێرەی یاساکانی واتاناسیی زمان دووپات دەکاتەوە یا وەری دەگێڕێت.وەك: ئەوەی کە بالادەستە، ئێجگار بەهێزە.

## Analytique
## شرۆڤەگەرانە، شیکاری

بە داوەری و هەڵسەنگاندنێکی (رێکەوەندی جەختکەرانە) دەگوترێت کە بەپێی نێوەرۆکەکەی هەمیشە درووستە و نەك سەبارەت بە هۆ (علت) و بەرهۆ (معلول) بوون. وەك : سێو میوەیەکە.

داوەریگەلی شیکارگەرانە هەمیشە راست و درووستن چونکە ئەم داوەرییانەرەمز و بنەواشەگەلێکی زمانی کە دەریان دەبڕێ نۆژەن دەکاتەوە ،نەك تایبەتمەندییگەلی سرووشتیی ئەو بابەتانەی کە مەبەستانن. ئەم بنەواشە و رەمزانە هەرچییەك کە لەلایەن کۆمەڵگەوە لە هەرِەتێکدا، بە درووستی لەبەرچاوگیراون تۆمار دەکا نەك راستییەکی رەها. داوەریگەلی شیکارانە، داوەریگەلی نیشانەناسین. هەرچییەك رۆنانی (ترکیبی ) لەبەرچاوگیرابێت بە لەسەرکۆکبوونێکی هەمەکی کە بنەواشە و یاساکانیان لێدەکەوێتەوە، دۆخی شیکارانە بەخۆوە دەگرن. هاوپەیوەستیی شوناس هاوپەیوەستییەکی شرۆڤەگەرانەیە، چەشنی هاوپەیوەستیی نێوان لەبەرگرەوەیی (شمول) و هاوگری (تعلق).

## Anaphore
## دووپات ، جوانکاری

زانستێك کە لەودا باس لە هونەرەکانی ئاخاوتە و جوانیگەلی پەیڤەکانی هۆنراوە و پەخشان دەکرێ.

## Animal (Symbolique)
## ئاژەڵ (سیمبۆلیك)

لە دیدی کاسیرێرەوە Cassirer ئەم ناولێنانە بۆ مرۆڤ بە سەرنجدان لە زاڵبوونی بەسەر سیمبۆلەکاندا وەك بڵیندترین نیشانەکان لە زنجیرەپلەی نیشانەکاندا لەبەرچاوگیراوە و سێبوك Sebeok لەمبارەوە
نارەزامەندی نواندوە، چونکە بە باوەڕی ئەو گیانەوەران سیمبۆل دەناسن.

## Animaux
## ئاژەڵان (گیانەوەران)

نیشانەناسیی گیانەوەران

## Anthroposémiotique
## نیشانەناسیی مرۆیی

نیشانەناسیی نیشانە مرۆییەکان، بیاڤی تەواوکەری نیشانەناسیی گیانەوەران و نیشانەناسیی ئاخنەیی (درونی،**باطنی**).

## Anti-donnateur
## نەدەر

لە نوختەنیگای جێنشینییەوە، نەدەر دەکەوێتە باشاری بدەرەوە و لە چواچێوەی پێکهاتەی گەنگەشەییی ئاخێو (**خطاب**، گفتمان) ەکاندا نەدەر دەتوانێ هاوتای نەیار بێت.

## Antiphrase
## ناکۆك

بەشێکە لە روخسارەکانی رەوانبێژی و هۆنینەوەی کەونار کە لێوەشاوەیی وەرگرتنی روونکردنەوەیەکی نیشانەناسیی دژواری هەیە. ناکۆك لە چوارچێوەی یەکەیەکی هاونشینیدا دەوری جێگرەوە (ئەلتەرناتیڤ) یەك دەگێڕێ لە دوو نیشانەدا کە لانیکەم خودان دوو نیشانەی بنچینە پێکناکۆك (پارادۆکسیکاڵ) ن. لە ناکۆکدا دوولایەن نە کۆ دەبنەوە و یەك دەگرن نە تیادەچن، وەك : هەبوون و نەبوو و ژین و مەرگ.

## Appartenance
## هاوگری ، خاوەنداری

لە بیرکاریدا : پێوەندیی ئەندامێك بە گشتکۆ (مجموعە)یەك کە لەبەرگرەوەیەتی ( پێوەندیی دەربڕاو لەلایەن a ε E).

لە واتاناسیدا : پێوەندیی نێوان ژێدەرێکی زەینی و گشتکۆی پێوەندیدار بەوەوە بە هەڤبەرایەتیی نێوان یەکە و هەمەکێك (کلی) کە لەبەرگرەوەیەتی.

باسلێکردن و وەسفی هەبوو و هەنووکەیی، دەبێتە هۆی رایەڵبوونی پێوەندیی خاوەنداری و شوناس.

بۆ نموونه :" هیمالیا بەرزترین لوتکەی جیهانە" یا " سەجادی، نووسەری رشتەی مرواریيە".

هاوگری دەتوانێ ناسێنەری شوناسێکی ناویی نێوان توخمێك و گشتکۆیەك له توخمـەکان کـه لـه شـێوەی نـاوێکی گـشتی دێتـە دەربڕین بێت، وەك : پشیلەی من ع (بەشێکه له) پشیلەکان.

## Appréciateur
### داوەر، ئەمەکناس

کەسێك یا شتێك که هێژاییەکی ئاستبەرزتری هەیە و توانایی نرخاندنە هەمەچەشنەکانی هەیە.

## Appréciatif,ive
### شیان مەزەندە، شیان داوەری

له کردەگەراییدا ( پراگماتیزم) دەدرێتەپاڵ نیشانەیەك که بەمەبەستی نرخاندن بەکارهاتووە.

نموونه : ئاوەڵناوی "بچووك" بە سەرنجدان له دەق دەتوانێ رادەیی، پەسنی یا سووکایەتیانە بێت.

## Appréciation
### مەزەندە، داوەری

داوەری لەبارەی شمەکی جێی مەبەستمان، باشتربوون یا خراپتربوونی، پێوەندیدارە بە هەموو شتێکی دەکارکراو(مصرفی) ەوە.

## Arbitraire
### دڵخوازانە، سەرپشکانە ( له نیشانەدا )

١ ـ پێوەندیی رێککەوتەیی لەنێوان نیشانەیەك و ژێدەرێکی زەینی. ئـەم پێوەندییـە رێککەوتەییـە چـونکه لـه رێککـەوتنێکی کۆمەڵایەتییەوە چاوگە دەگرێ نەك له رێککەوتنێکی سرووشتی.

دڵخوازانەبوونی نیشانە بەلای زمانناسانەوە یەکێك له تایبەتمەندییەکانی بنچینەییی زمان دێتەئەژمار.

ناولێنراوەکان یا ناوی دەنگەکان له زماندا، لـه بیـاڤی دڵخوازانـەبوونی نیـشانەکان دەهاوێژرێنـەدەرێ چـونکه دووپاتبوونـەوەی فۆنەتیکییان، ئەو دەنگەی که مەبەستە دەکاتەوە.

٢ـ بەلای سۆسێر Saussure ەوە پێوەندییەکی نارێککەوتەییە لەنێوان ئاماژەپێکەر و ئاماژەپێکراودا.

ئەم لێکدانەوەیە له دیاردەی دڵخوازانەبوون، بەهۆی ناهەواهەنگیی خودیانەی نێوان دەنگ و واتا، لەگەڵ ئەوەشدا که هەردووکیان وێنەگەلی زەینین، باسهەڵگرە.

## Architecture
### تەلارسازی ( پێکهاتە )

سیستمی نیشانەناسیی شمەکی کاربەرانە،که له بەرانبەر هونەرەپەتییەکاندا بە چەشنێکی بەرتەسك دەرکەوتی هەیە.لـه چـەمکی هەمەکیدا تێکڕای شمەکانی سازکراوی سێ رەهەندی پەیوەستن بە تەلارسازییەوە (بۆ نموونه : ماشین، میکرۆسکۆپ، چەنگاڵ) ـــ له چەمکی نەریتی و سنووردارادا لەبەرگرەوەی بە بیناکردنی فەزای مرۆیی و بەتایبەت شوێنی نیشتەجێبوونە.

بەگشتی تەلارسازی بە سیستمێك لەگەڵ دووجۆرە رەنێوهانین دەزانرێت. دەتوانی رەمزگەلی سینتاکسی لەبۆی رەچاو بکەیت ( هۆکارەکانی درووستکردن : دینگە، تەختە، خشت و هتد) وگەلێ رەمزی واتایی. ١ـ هۆکارانی گرێدراو لەگەڵ کارکردەگەلی فرەچەشنی خۆیدا (بنمیچ، هەیوان، پلیکانە و هتد)

بۆ کارکردەی یەکەمین بەسوودن و بۆ کارکردەی دووەمین، سیمبۆلیکن. ٢ ـ هۆکارانێك کە ئاماژەی پەنانەکی لەسەر شوێنێکی نیشتەجێبوون دادەنێن.

## Argument
## بەڵگە، هەنجەت، بنگە و پێشەکی

بەرهەڤدانێکە پێکهاتوو لە بەراییەکانی ئەرخەیانکەرەوە کە هەتا دەگاتە بەرەنجام ئەرخەیانکەرەوەن نەك گومانهێن. هەروەك دەڵێن "هەموو مرۆڤێك گیانەوەرە و هەموو گیانەوەرێکیش تەن ( جەستە، جسم) ێکە". کەوابوو بەرەنجامەکە بریتییە لەوە کە هەموو مرۆڤێك تەنێکە.

## Articulation
## دەربڕین، رەنێوهێنانی دەنگ، روونکاری

شیرازەیەکی هێڵی یا ناهێڵیی یەکەکانی شیاوی ناسینی سیستمێکی واتایی.

روونکاریی مۆرفیمەکانی رێکەوەندەکان (عبارت ها) و رستەکان بەگوێرەی رێساکانی گەردان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی پێوەندی و رۆنانیان دەبێت. روونکاری سەرەتا دەپەرژێتەسەر نیشانەکان و پاشان میتافۆرەکان.

## Asémantique
## ناواتا

بەو رستانە دەگوترێ کە لەباری واتاییەوە پێکهاتەییەکی نالەباریان هەبێت دەگوترێ.

رستەی "ناواتا" دەشێ نە چەوت بێت و نە راست. بەلای برێك زمانناسانەوە رستەی ناواتا بەدەر لە واتایە،وەلێ نێوەرۆکێکی هەیە.

دەبێ ئەوە لەبەرچاوبگریت کە رستەگەلێ کە کۆمەڵە رەمزێك نۆژەن دەکەنەوە لە بەرانبەر ئەو رستانەی کە پێشیلی دەکەن بە ناواتا ئەژمار دەکرێن.

## Asémasie
## پشێوی یا لەدەستدانی توانایی فامکردنی نیشانەکان

بە پەیامێك لە هەر سیستمێکی واتایی دەگوترێ کە لەباری نێوەرۆکەوە خراپ سازکرابێ. بۆ نموونە، پشێوی لە وەرگرتنی پەیامی "هاتنەژوورەوە قەدەغەیە" و "تێپەڕین قەدەغەیە".

## Attribut
## سیمبۆل، نیشانەی وەسفی

سیمبۆل کە ناسێنەری کەسایەتییەکە وەك : کڵاوەکەی مستەفا خۆشناو.

## Audio –visuel
## دیداری ـ بیستاری

پێوەندیدارە بە وێنە لەگەڵ دەنگدا.

پێوەندیی دیداری ـ بیستاری : سینەمای دەنگدار، تەلەفزیۆن.

## Auteur
## نووسەر، دانەر

بکەری پێوەندیی ئاخاوتەیی یا وێژەرەوە کە دەق دەنووسێ.

دانەر دەتوانێ گێڕەرەوە بێت یا لەو جیابێت. ئەو گوتەکانی گێڕەرەوە دەگێڕێتەوە و لەباری دەروونناسییەوە دەپەڕژێتەسەر هەمدیسوێژی (نقل قول) و لە بەرانبەر گێڕەرەوە رادەوەستێ. چەشنی کەسێتییەکانی چیرۆك کە قسان دەکەن (قارەمان) و کەسێتییەکانی دەرەوەی چیرۆك کە لەبارەیانەوە قسان دەکرێ و تێکڕای دەق لە شێوەی گشتکۆیەکی هەمدیسوێژی کاردەکات. لەڕاستیدا چیرۆك گێڕەوە هەمان دانەری شاراوەیە و کەسێتییەکانی چیرۆك  دانەری ئاشکران. هەموو جارێ بەرپرسی هەڵبژاردنی بابەتگەلی پاشبار وێژەرەوە و بابەتەکانی ئاخێون. لە نڤیساری نوێدا دەنگەکانی گێڕانەوە جاری وا هەیە تێکەڵ بە یەکن و بە چەشنێکی دیاریکراو دەروەستی ناسین نایەن.

## Autodiégétique
## وەسفکردنی چوونیەك

بە هەقایەتێك دەگوترێ کە چیرۆك گێڕەوە قارەمانی چیرۆکیشە. وەك کورتەچیرۆکی **هەور بارانی لە ئامێزگرتوە** ی هوشەنگ گولشیری.

## Autographique
## ئەسکاڵتسازی(بدل ساز) هونەری خۆتۆمار

بە هونەرێك دەگوترێ کە لە قەڵەمڕەویدائەسکاڵتسازی دەلوێ وەك رەسەنبوونی بەرهەم بۆ مێژوو دەگەڕێتەوە. بۆ نموونە نیگارکێشان هونەرێکە دەشێ ئەسکاڵتسازی بکرێت.

## Autonyme
## خۆنیشانە، نیشانەی بانزمانی یا بان واتاناسی

خۆنیشانە تەنیا لە زمانانی سەرتر دا ئاشکرا دەبێ و لەبەرچاوگرتنی تێکڕای نیشانەگەلی وێنەیی یا دەنگی لەواو دەکا ئەوەش بەبێ درووستکردنی وشەیەکی نوێ.پێکهاتەی ئاوێنەیی ئەگەر بێتو تاودەرانە (انعکاسی) بێت، پێوەندیداری خۆنیشانەیە. لە

"ئێجگار، خۆی ئاوەڵکردارێکە" : ئێجگار خۆنیشانە ئەژمار دەکرێ.هەرنیشانەیەکی سیستمی واتاناسی توانستی ڕەنێوهێنانی خۆنیشانەیەکی هەیە، وەك :

زناکی Ø بە واتای "هاتنەژوورەوە قەدەغەیە".

## Autonymie
## خۆنیشانەیی

هەرچییەك خاوەنی خۆنیشانە بێت.

## Autoréférence
## خۆگەڕاوەیی

بارودۆخی نیشانەیەك،پەیامێك، کە لەخۆوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆ.

"خۆگەڕاوەیی" لە زمانی سۆسێردا لەمەڕ نیشانە یەکانگیر نیە، چونکە بە باوەڕی ئەو نیشانێك کە لەبارەیەوە دەدوێین هەر ئەو نیشانە نیە کە لە قسەکردندا بەکاری دەبەین. وەك:" ئەم ڕستەیە پێنج وشانی هەن." کە گەڕاوەتەوە بۆ ڕستەکە خۆی. لە ریزبەندیی زمانیدا ڕستەگەلی خۆگەڕاوەیی بە ڕستەگەلی ناواتا ئەژمار دەکرێن.

## Autorégulation
## خۆ ڕێکخەری

کارکردەی ئاخێوێك لە ڕەوتی پێوندییەکی ئاخاوتەییدا، چ لە پێوەندی لەگەڵ نیازی نێردەری پەیام بێت، چ لە دابەشکردنی ڕەمزەکان لەگەڵ وەرگری پەیامدا هاوپشك ببێت.

"خۆرێکخەری" ی ئاخێو لەڕێگەی ڕاڤەگەلی بان ـــ زمانناسییەوە ئەنجام دەدرێ.

## Avant – texte
## پێش دەق

یەکەمین لێکدانەوەی دەقێك کە دانەر خۆی یا نووسەرەکەی بەرتەکی بداتەوە.

## Axe
## تەوەر

تەوەری جێنشی ـ تەوەری واتایی ـ تەوەری هاونشینی

## Axiologie
## لێکۆڵینەوەی بایەخەکان

لێکۆڵینەوەی بایەخەکان ـ لێکۆڵینەوە لە ڕەفتاری بەرایی

## B

### Bande dessinée
### گاڵتەجاڕی قەڵەمی، بزۆزەنیگار

سیستمێکی گێڕانەوەیی تێکچڕژاو کە لە ڕێگەی دیدارییەوە پەیامی خۆی بە یاریدەی گشتکۆ (مجموعه) یەك لە وێنەگەلێ کە خۆیان خودان دەربڕین و پەیامێکن، دەخاتەڕوو.

ڕێکخستەی گێڕانەوەیی بیچمێکی دیاریکراو دەگرێتەوە و ئەوەش شریتێکە ناگەوهەری لە چەند گەڵاڵەیەك کە پێوەندیی وێنەیی رایەڵ دەکات. ئەم پێوەندییە دەتوانێ لەبەرگرەوەی وێنەگەلێ بێت کە لە بلّق (حباب) ێك کە نێردەری پەیام مەبەستیەتی دادەنرێ، یا دەقێکی شیاو بە وێنەوە دەخرێتەنێو وێنەوە.بەربێژەکەی، منداڵان، هەرزەکاران و توێژێکی تایبەت لە گەورەساڵانن.

### Barre
### شمشە، هێڵ / //

نیشانەی بەئامێربوو(تکنیکاڵ) کە لە ئاخێوی نیشانە ـ واتاناسیدا بە دوو شێوە بەکاردێت :

شمشەی سادە کە لە دوولای زنجیرەئاخاوتەیەك تۆماردەکرێ، وەدیاردەخات کە قسەوباس لەمەڕ ئەو زنجیرەیە دەکرێ. شمشە، زمانی سێیەم لەنێو جووت کەوانەکان دەگرێتەوە، وەك: رستەی/ : ئەو وتی: "نا"/. دوو شمشە نیشان دەدات کە نیشانەکانی نێوان ئەم دوو شمشەیە ئاخاوتەیی نیە : ئەو // جووڵەیەکی پەشۆکاوی// کرد.

### Bâton à entailles
### چێوهێڵ

سیستمێکی پێوەندیی کۆن کە هێشتاش بەکاردێت و لە مەودابەندییە بگۆڕەکان لەسەر چێوێك پەیامێك سازدەکا.

ئەم مێتۆدە داتاژمارەییەکان بۆ بەربێژ دەگوازێتەوە و بە تۆماری بنەچەی نامەکان وەك جۆرە ڕێککەوتنێك بەکاردەبرێ.

### Biosémiotique
### زیندە نیشانەناسی، بیۆسیمیۆتیك

نیشانەناسیی جیهانی زیندووی نامرۆیی،کەوابوو نافەرهەنگییە.

### Bit, Binit
### بیت

یەکەی پێوانی گشتکۆیەك لە زانیاریگەلی دوانی ـــ دووان دووان ـــ توخمی زنجیرەیەکی دوانی.

### Bruit
### خشە، دەنگی نامۆسیقایی

هەرچییەك کە لە گواستنەوەی زانیاریدا، هەرەسی کردەی واتایی لێ بکەوێتەوە.خشە دەشێ لە چەمکی ئاسایی خۆیدا بێت یا خۆ وشەیەکی لێڵ بێت یا خۆ هەرچییەك کە پەیام دەشارێتەوە.

# C

## Calque

### وەرگرتنەوە، وەرگێڕانی قەرزی

پاچڤەی ئەدەبیی یەکەیەکی لێکدراوی رەمزدار کە واتاکەی بەستراوە بە توخمەکانی نیە.( نموونە: hot-dog ی ئینگلیزی کە بە جۆرە بابۆڵەیەك دەگوترێ و ئەگەر بمانەوێ پاچڤەی بکەین دەبێ بێژین " سەگی گەرم" کە وەها ناگوترێ و هەمان پەیڤی خۆی بەکاردێت.)

وەرگرتنەوە لە تێکڕای یەکەگەلی لێکدراوی رەمزداردا هەیە ( وشانێکی پێکهاتوو لە چەند مۆرفیمێك، وشانی لێکدراو، لێکدانەوەکان، پەندەکان).

## Canal

### کەنداڵ، بوودڕ، دڕناڵ، نۆکەند

ئامرازی پێوەندیگرن، کانداڵی فیزیکی، کیمیایی، کانداڵی تێرۆژی،دەنگی و ئەلکتریکی و هتد.

سۆسێر لەو کەسانەیە کە نۆکەندی بۆ دەربڕینی زمانێك بە یەکلاکەرەوە دەزانێ. دوو زناکی سیستمێك ناتوانێ بەشێوەیەکی هاوکات لەسەر نۆکەندێك کار بکات.

## Caractère

### زناك، پیتگەلی چاپی

١- نیشانەی وێنەیی یاسادار کە ئەلفوبێی نیە و زمانی ئاخاوتن بەپێچەوانەی پیت دەنوێنێ.

وەك: پیتگەلی دەستنووسی چینی.

٢- پیتگەلی چاپی، قاڵبی کانزایی (یا هەر ماکێکی دیکە) کە بچووکترین توخمێك کە لە هەر زمانێکدا جیاوازە بەشێوەی زەق دەگرێتەوە و بۆ نووسینی دەقگەلی چاپی بە نموونانی هەمەچەشنەوە بەکار دێت، وەك : t ی بچووك،Tی گەورە، هەرچییەك لە (و) دەچێ، نوختە لەسەرï نوختەی ئیتالیك،à ی فەرەنسی،ü ی ئاڵمانی،ñ ی ئسپانیۆلی، π ی یونانی و هتد.

پیتەکان بارتەقا و بیچمگەلی جیاوازیان هەن وەلێ توخمگەلی برەودار لەخۆدەگرن.

## Carrré

### چوارسووچ، چوارگۆشەناسی

چوارگۆشەی واتاناسی پێکهاتەگەلی سەرەتایی پێشنیارکراو لەلایەن گرێماسەوە:

بیچمۆکەیەك کە ناکۆکی و دژیەك پێکەوە گرێ دەدات.

ـ نموونە، نیشانانی وشەیی:




**Cellule constructive**

**بنماكی رەژیدە (یاختە سازندە)**

sunok لە زمانی رووسیدا یەكەی مۆسیقاییی پێوەندیگەلی زمانییەو گەورەترین پارسەنگ بۆ تێكڕای كەرتەكانی بیچم (شكل) ئەژماردەكرێ.

بنماكی رەژیدە لە شیعردا لەگەڵ برِگە دەشێ بەراورد بكرێت. بنماكی رەژیدە، ئیسكەبەندی هەرِەتیی بەرهەم دەرِەخسێنێ.

**Certitude**

**ئەرخەیانی، بێگومان، دانایی**

ئەرخەیانی بینیی پێوارەكان (غیوب) ە بە مەبەستی دۆزینەوەی بەراوەژووكان و تێبینیی رازەكانە بە بەربێژیی(موخاتەبە) بیرەكان.

**Champ**

**بیاڤ ، مەیدان**

بیاڤی هزری ـ بیاڤی واتایی ـ بیاڤی زمانی

**Charade**

**مەتەڵ ، لیچار**

وەشێردراو، داپۆشراو. ناوێك یا واتایەك كە هەوڵ بدرێ بشاردرێتەوە و بێجگە هزری تەواو و ئێجگار بیركردنەوە نەتوانە پەی بە واتای بەریت.

**Chiffre**

**ژمارە ، رەمز**

پیتەكانی یەكەمی ناو كە پێكەوە جووتیان دەكەن و لەسەر شمەكان دەیاننووسن و بە ژێررەمز دێنە ئەژمار.

## Chrononyme
### کاتپێو

هەندێ لە نیشانەناسان لە تەنیشت وشانی نوێی شوێنپێو و ناوپێو، وشەی نوێی کاتپێوییان بۆ قۆناخەکانی کات وەك "رۆژێکی تەواو"، "بەهار"،"سووڕان" پێشنیار دەکەن.

وشەی " قۆناخ" بە ئاسانی دەتوانی بکەیتە جیگرەوەی "کاتپێو".

## astiqueéCin
### سینەمایی

وەپاڵ هەموو ئەو خاڵانە دەدرێ کە بە فیلمسازەوە پێوەندیدارە، بەپێچەوانەی " فیلمێك" کە پێوەندیی بە تەماشاوانەوە هەیە. نیشانەناسیی سینەمایی نیشانەناسییەکی رەمزسازە.

## Cinéma
### سینەما

سیستمی واتاییی پێکهاتوو لە چەندین سیستم کە هاوکات بەکاردەبرێت: ١ـ سیستمی جووڵەیی (بزاڤ) ٢ـ سیستمی سیماناسی، وێنەیەك کە بەکاری دێنیێ وەلێ لێی بانتر هەڵدەکشێ. ٣ـ سیستمی زمانی فۆنیمی یا هێڵکێشی ( ژێرنووس) ٤ـ سیستمی سیماناسیی فۆنیمی (دەنگەکان) ٥ـ سیستمی مۆسیقایی. سینەما لە دوو دڕناڵ (مجرا) کەڵك وەردەگرێ، هەربۆیە بە هونەری بیستاری ـ دیداریی دەزانن. بەلای (ئۆمبێرتۆ) ئێکۆ Eco وە سینەما رەمزێکە بە سێ دەربڕین کە وەسەریەکنان یا مۆنتاژ، رێزمانی سینەما دەڕەخسێنێ.

## Ciméme
### هۆکارانی رەنێوهێنان ( تولید،انتاج ) ی سینەمایی، ( تەرخانەی سینەمایی )

لە دیدی پازۆلینی pasolini ەوە هۆکارانی رەنێوهێنانی سینەمایی، دووەمین یەکەی رەنێوهێنانی سینەمایی ئەژمار دەکرێت.

## Cinétique
### لێکۆڵینەوەی جووڵەکانی دەست و روخسار

ئەم زانستە دەپەرژێتەسەر لێکۆڵینەوە لە جووڵەکان، رەفتار،حاڵەتەکان، کایەکانی لەش، جووڵەکانی لەش و سەر و کارگەلی تێکچڕژاوی وەك رێ و رەچەکان، دابەکان و پانتۆمایم یا لاڵ لالێن.

## Citation
### بەڵگەوەپاڵدان ( استناد )، هەمدیسوێژی ( نقل قول )

رێکەوەند (عبارت) ی رەمزدانەنراو یا بەشێك لە رێکەوەنی رەمزدانەنراو کە بانتر لە وشەیە و بە بابەتێکی دەربڕین (بیانی) ی دیکە دووبارە سازدەکرێ و ناوێکی بەرایی لەگەڵدایە، وەك جووت کەوانە (گیومە) لە رەمزگەلی وێنەییدا.بەڵگەوەپاڵدان کە قسەی

نووسەر لەحاڵێکدا کە بەواتای مەبەست وەفادار ماوەتەوە زیندوو دەکاتەوە، لەلایەن ئاخێوەرەوە دەرەخسێ و هەمیشە دوو بابەتی دەربڕینی هەیە، ئاخێوەرێك کە ناوەکەی نادرکێنرێ و گوتراوێك کە ناوەکەی دەدرکێنرێ، بەڵگەوەپاڵدان دۆزێکی بانزماننناسانەیە.

بەڵگەوەپاڵدان دەتوانێ جیاجیا لە سەرەهەودای ئاخاوتە دا لە شێوەی بەردەنووسە یا لەنێو رستەی ئاخێوەر جێی دەبێتەوە.ئەگەرکو ئاخێوەر و گوتە یەك کەس بن، خۆبەڵگەداریی پێدەوترێ.

بەڵگەوەپاڵدانی بەرباس یا بەشێوەی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ و لەگەڵ جووت کەوانەدایە، کە لە یەکەمیاندا پێشڕەوییەکە لەلایەن ئاخێوەرەوە و لە دووەمیاندا لێوەرگرتن و بەردەوامیی قسەوباسی ئەویدییە لەلایەن ئاخێوەرەوە.

## Citeur
## بەڵگەوەپاڵدەر، باسگێڕەوە، هەقایەتخوان

کەسێك کە کاری گێڕانەوە و بەڵگەوەپاڵدان رادەپەڕێنێ. هەقایەتخوان بە واتایەکی دەقاودەقی ئەدەبی.

## Clôture
## بنەتادار، بەکۆتاهاتن

شتێك کە سەرەتا و بنەتای هەیە. پایانە (اختتامیە) ی دەق، فیلم.

چەمکی هەمەکیی بنەتادار لە نیگای فراژوورییەوە باسهەڵگرە، وەك بابەتی بە کۆتاهاتنی بەرهەمێك.

## Code
## رەمزگەل، رەمز، هێما

هەر سیستمێکی سیمبۆلیك کە لە سای رێککەوتنگەلی پێشووتر بۆ نیشاندان یا گواستنەوەی هەواڵێك لە خاڵی دەسپێکەوە بۆ خاڵی مەبەست لەبەرچاوگیرابێت ( بە پێچەوانەی پەیام).

هەودای رەمز پەیام رێپێدراو دەکات. پەیامەتازەکان خۆیان رەخسێنەری رەمزگەلی تازەن و ئەمە لۆژیکی رەمزگەلی پەیامە.نیشانەناسیی رەمزگەل و پەیام لێکدانەبڕاون.

زۆربەی سیستمەکانی نیشانەناسی خودان رەمزگەلن کە برێك جار ئەم رەمزگەلە تێکچڕژاوە و لە رەمزگەلی جیاواز وەرگیراوە. رەمزێك دەتوانێ لە تاکە نیشانەیەك دروستکرابێ، وەك: گۆچانی سپیی نابینا.

بەشداری لە رەمزدا، هەر هەمان خاوەنداریی رەمزێکی تاقانەیە بۆ نێردەر و وەرگر ( ئەم هەرامەیە نایەتە دی بێجگە لەمەڕ رەمزەساکارەکان کە بەتەواوی دەستنیشانکراو و ناسراون.).

گۆڕانی رەمز، گۆڕان لە رێککەوتنەکانە کە دەشێ لەلایەن نێردەرەوە رەخسابێت، وەك گۆڕانی هێماکانی نێوان رێگا، یاخۆ رۆنراوی رێکانە (توافق) ی نێوان نێردەر و وەرگر بێت، ئەوکاتەی کە وەرگریش پەیامێك دەنێرێت.

رەمزگەلی جووڵەیی یا دەربڕاو، رەمزانێکن پێوەندیدار بە بزاوتەکان و فامکردنی بیچمگەلی سەرەتایی. رەمزی لێکهاوێرگەرانە (تشخیصی)، پەیدۆزی (شناسایی) ی شمەکێك لە سەرباقی لواو دەکا. رەمزی روخساری، هاوسەنگیی نێوان نیشانەیەکی وێنەیی و توخمێکی گونجاوی رەمزی لێکهاوێرگەرانە رایەڵ دەکات.

## Codé, ée

### ڕەمزدار

١ـ بە سیمبۆلێك، نیشانەیەكی ڕەمزگەلی پەیامێك دەگوترێ كە لەودا دەردەكەوێ.

٢ـ بە بەرودوایییان (پی رفت ها، سكوانس) ی تەوەری هاونشینی كە ڕەمزدانەر نـاتوانێ بەئاسـانی لـە رووی توخمگـەلی هـەبوو دروستیان بكات و هەموو درووستكراوەكانی ڕەمزی لەخۆدا هەڵگرتوە، دەگوترێ

وەك " هۆڵی نانخواردن" یا " جەوتی سەركێوان گەلێ چاتر لە تالێی شارییە" ( نالی).

دەبێ وشەكانی زمانێك ( ناولێنراو و وشە) كە ڕەمزدارن لە یەكەگەلی بەرینتری ڕەمزداری وەك لێكدانەوە و پەندەكان لێك هـاوێر بكەیت. بۆ نموونە " هەنگوینی" مەرج نیە بە هەنگوین هەڵسوا بێت، هەنگوینی مێزێكی بچووكە كە دەخرێتە تەنیشت ئەسكەمل (كرسی،صندلی) یێك و یا ڕەنگێكی تایبەت وەبیردەخاتەوە.

## Codification

### ڕەمزپەڕژان

١ـ ڕەمزپەڕژانی نیشانەیەك

پرۆسەیەكە كە بە یاریدەی تەواوی كاركردگەلێ كە باشقەیەك درووست دەكەن دێتەنێو ڕەمزگەلەوە، وەك ڕەمزپـەڕژانی وشـەیەكی نوێ. ڕەمزپەڕژان هاوپێوەندییەكی تەواوی لەگەڵ پانتایی كاركردەكان لە پێوەندییەكاندا هەیە.

٢ـ پرۆسەیەكە كە بە ڕێچكەیدا زنجیرەی ئاخاوتەیی سەربەست دەبێـت بـە زنجیرەیـەكی ڕەمـزدار و پێوەندیـدارە لەگـەڵ پانتاییـە كاركردییەكەی.

## Cognitif

### ناسینەیی

هەرچییەك كە یارمەتیی هەمواركردنی ناسین دەدات.چەمكێكی واتاناسانە كە دەردرێتەپاڵ واتایەكی راشـكاوەوە و لـە بەرانبـەر واتای پەنامەكی پۆلێن دەكرێ.

## Co – hyponyme

### هاوگرەوە، هاوواتاگرەوە

نیشانەیەك كە لە پێوەندی لەگەڵ ئەویدی هەمان پێگەی واتاییی هەیە. وەك مێز و كورسی كـە هـەردووك " شـوێنی دانیـشتن" دەگرێتەوە.

## Communication

### پێوەندی، پێوەندیگرتن

گوێزرانەوەی پەیام بەهۆی نیشانەكان، زناكەكان لە نێردەر بۆ وەرگر لە ڕێگەی كەنداڵێكەوە.

پێوەندی باش كار ناكات، مەگەر ئەوكاتەی كە ڕەمزەكان و زناكەكان لە پێواری دەنگەكان یا خشەكان باش دابەشكرابن.

دەوری پێوەندیگرتن، هەمان رەنێوهێنانی واتاییە کە بەربێژی ئەو پەیامە، وەرگرە و بەپێچەوانەی پەیڤی نێوەکی کار دەکات. پێوەندیی چەند روخساری لەلایەن نیشانەکانی سیستمەهەمەچەشنەکان و لەرێگەی کەنداڵانی جیاواز دەرەخسێ، وەك زمان، دەمەلاسکێ و جووڵەکان، هێماکان لە پەیامێکدا و ئەمە باوترین چەشنی پێوەندیی نێوان مرۆڤانە.

پێوەندیی هەستەوەری، پێوەندییەکە کە لە زمانەوە بەرەنجامگیری دەکرێ و لەسەر بنەمای یەکانگیریی هۆگرییەکان سازدەکرێ.

پێوەندیی جەماوەری جۆرە پێوەندییەك لە کۆمەڵگەیەکی پیشەسازییە کە گرۆگەلی رەنێوهێنی پەیام، زۆرترین کەرەستەگەلی پێوەندیکارانەیان لەبەردەستدایە و رێچکانێك کە بە پەرانپەرانی دەستنیشاننەکراو دەگەنە بنەتا بەکاردەبەن.

توێژینەوەی پێوەندیی بەکۆمەڵ پێوەندییەکی میانهەودا (میان رشتەای) یە ( دەروونناسی، جڤاکناسی، فێرکاری)، رۆژنامەکان، بزۆزەنیگارەکان، ریکلامەکان، سینەما، رادیۆ، تەلەڤیزیۆن  بە پەرانپەری پێوەندیی بەکۆمەڵەوە پێوەندیدارن.

## Commutation
## جێنشینی

چوست و چالاکییەك لە رێکەوەندێك (عبارت) دا کە برگەیەك لەجێی برگەیەکی دیکە دادەنێ بەجۆرێك کە رێکەوەندێك شایانی پەسند بێنێتەوە، جیاکاری لە ئاماژەپێکەردا، دەبێتەهۆی جیاکاری لە ئاماژەپێکراودا.

## Compétence
## توانست، توانایی

پەیدۆزیی رەمزێك، توانستی ئایدیال، پەیدۆزیی ئایدیالی رەمزێك لە تەواوەتی خۆیدایە.

## Complémentarité
## بەشینەوەی تەواوەتی

پێوەندیی نێوان سێ وشە یا زاراوە بە شێوەیەك کە A تەواوکەری B لە پێوەندی لەگەڵ C کە گشتکۆیانە بێت.